گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتیی ئەهلیە بۆ منداڵان



16

# کەناری

# KENARI





دیاری ژمارە وەربگرە..

# نووسین





زۆربەی خەڵکی لەسەر ئەو رایە کۆکن کە نووسین گرنگترین و بەهێزترین داهێنانیان لەمێژوی مرۆڤایەتیدا، ئەگەر نووسین نەبوایە کەوا نە کتێب و قوتابخانەکان و گۆڤارو رۆژنامەکان و نوسینەکان و یادەوەریەکان نەدەنوسرانەوە بەڵگە نامە مێژووییە گرنگە شارستانیەکان نەدەمانەوە.
نوسین بە هەزاران ساڵ پێش ناسینی قەڵەم و پەرەموچ و مەرەکەب و کاغەز دەرکەوتووە هەروەکو ئەوەی کە ئێمە دەزانین مرۆڤی کۆن چۆن لەسەر دیواری ئەشکەوتەکان وێنەی گیانلەبەرەکانیان کێشاوە.
میسریە کۆنەکان جۆرێك لە نووسین فێر بوون کە پێیان دەووت (هێرۆگلیفی) کە لەنووسینی وێنەدار دەچوو بەڵام وێنەکان هێما بون بۆ دەنگەکان. سامیەکان پیتی ئەبجەدیان داهێنا لەگەڵ وێنەکاندا هێما بو بۆ دەنگەکان هەر لەوانەوە پیتە ئەبجەدیەکان گەیشتە ئیگریك و هەندێ وڵاتی عەرەب و هیند. عەرەبەکان لە فینیقیەکانەوە نووسین فێر بوون کە ئێستا ٢٨ بیتە.
لە ئیگریکیەوە گەیشتە رۆمان کە چەند پیتێکیان بۆ زیاد کردو شێوەی هەندێکیان گۆری پاشان گەیشتە زمانی ئینگلیزی لەگەڵ هەندێ گۆراندا پیتەکان ٢٦ پیتە لێرەوە دەردەکەوێت کە میسریە کۆنەکان رەسەنن لە نووسیندا .. لەزمانی کوردیشدا بە هەمان ئەبجەدی دەنووسین لەگەڵ هەندێ گۆرانکاری ووردا.. شێوازی نووسینی کوردی بە پیتی لاتینی لە بارترین شێوازە.







لە کتێبی
تیۆری موسیقا
دلێر ئیبراهیم

# کلیلەکانی مۆسیقا

بۆ ئەوەی حەوت نەواکان (النغمات السبعە) لەچەند چینێکی جیاوازدا بنوسینەوە لەروی ناسکی گرییەوە کە ئەگاتە نزیکەی حەوت چین و پلیکانەش هەموویان ناگرێ، چونکە تەنیا جێگای پانزە نەوای لەسەر ئەبێتەوە بۆیە چەند نیشانەیەکی تایبەتی بەدی هێنراوە پێیان ئەوترێ (کلیل) لەسەرەتای پلیکانەکەدا دائەنرێ بۆ دیاریکردنی ناوو چینی هەموو نەوایەك، بەم شێوەیە نەواکان لەوەندەی جێی هەیە لەسەر پلیکانەکە ئەنوسرێتەوە لەجیاتی ئەوە هێلی زیادی زۆرتر بەکاربهێنرێت بۆ دیاریکردنی ئەوەی ماوەتەوە لە حەوت چینەکە.




## ١.٦.١کلیل

نیشانە یا عەلامەتێکی مۆسیقایە لەسەرەتای لا چە پی پلیکانەکانەوە لەسەر یەکێ لە هێڵەکانی دائەنرێ بۆ دیاریکردنی ناوو چینی هەموو نەوایەك (یاخود هەر نۆتەیەکی مۆسیقا) و سێ جۆر کلیلمان هەیە :

١.١.٦.١کلیلی سۆل (کلیلی کەمان clef Treble) ئەم کلیلە بە پیتی (G) ئەناسرێتو، لە پەرەپێدانی کێشانی ئەم پیتەوە گەیشتوە بەم شێوەیەو ئەم کلیلە لەسەر هێڵی دووەمی پلیکانەی مۆسیقا دائەنرێ بۆ دیاریکردنی ئەوەی هەر نیشانەیەکی مۆسیقا لەسەر دووەم هێڵە دانرا پێی ئەوترێ (دەنگی صۆل) ئەم کلیلەش بۆ ئەم ئامێرانە بەکاردێ (ڤایۆلین یان کەمانچە، فلووت، کلارنێت، ئۆبۆ، دەستی ڕاستی ئۆکۆردیۆن.. هتد) ماوێتی..





# گەمەی شادومانی



هیتیو لینیو دینی سێ هاوڕێی خۆشەویستی یەك بوون، بڕیاریاندا هەر یەکە بە جیا خانویەك بۆخۆی دروست بکات.



لینیو دینی خانووی خۆیان تەواو کرد.



لینی بە کەمانچەکەییو دینی بە شمشاڵەکەی دەشتو دەریان پڕ کرد لە خۆشیو گۆرانی.



هیتی هێشتا هەر خەریکی خانوو دروست کردنەو بۆی تەواو نابێت.



بۆیە لینیو دینی کەوتنە گاڵتە پێکردنی.



لینیو دینی بە ئارەزووی خۆیان کەوتنە گەمەو یاریو ڕاوەماسی و قرژانگ.



هیتی دوا بەردی تەواکردنی خانووەکەی دانا.



بە گەمەویاریەوە بە دیوارەکەیدا هاتە خوارەوە بۆلای لینیو دینی.



پۆفە گورگە! ماوەیەکە بەدوایاندا وێڵە، باشترین دەرفەتیش ئەوەیە خانوەکانیان بڕوخێنێت.



بەتایبەتی خانووی دینی و لینی کە بە پوش و دار دروستکراون.



خانوی لینیو دینی بەسەر یەکدا روخاندو تەفر تونای کردن، بۆیە بەناچاری لینیو دینی ڕایان کردە خانووە بەردینەکەی هیتی.



مام گورگ ئیتر نەیتوانی زەفەریان پێ بەرێت ئەوانیش بڕیاریاندا پێکەوە بژین و جارێکی تر لە یەکتر دور نەکەونەوە.

ئەو وێنانەی لە یەك دەچن بدۆزەرەوە پاشان ئەو خۆراکانەی
پەیوەندیان لەگەڵ یەکدایە جیا بکەرەوە..



# مافەکانی من

**بەندی :٢٦**

منداڵ مافی هەیە کەڵك لە دابینکردنی (بیمەی) کۆمەڵایەتی وەربگرێت.

**بەندی :٢٧**

هەموو منداڵێك مافی ئاستی ژیانێکی گونجاوی هەیە لەگەڵ گەشەی جەستەییو عەقڵیدا بگونجێو ئەمەش ئەرکی باوانەو دەوڵەتیش ئەبێ یارمەتی بەجێ گەیاندنی ئەم ئەرکە بدات.

**بەندی :٢٨**

منداڵ مافی خوێندنی هەیەو دەوڵەت پێویستە لانی کەم خوێندنی سەرەتایی ناچاریو خۆرایی بکا بۆ هەمووان. سیستمی قوتابخانە دەبێ لەگەڵ مافەکانو کەرامەتی منداڵ دا بگونجێ.

**بەندی :٢٩**

ئامانجی خوێندن ئەبێ پەرەپێدانی کەسایەتیو تواناکانی منداڵ بێو ئامادەکردنی بێ بۆ ژیانی داهاتوو، هەروەها پەرەپێدانی ڕێزگرتنی منداڵ لە باوانو بەها نیشتمانیەکانو مافی خەڵکانی تر.

**بەندی :٣٠**

منداڵانی کەمە نەتەوایەتیەکانو دانیشتوانە ئەسڵیەکان مافی ئەوەیان هەیە زمانو ئایینو کلتووری خۆیان بەکار بێنن.

**بەندی :٣١**

منداڵ مافی حەوانەوەو یاریو بەشداری کردنی چالاکی ڕۆشنبیریو هونەری هەیە.

# یەکتری ناسین

## وورچ



من بێچووە (وورچ)م
دایکم ناوی دەڵە وورچە
باوکم ناوی نێرە وورچە
تەمەنم (٤- ١٠) ساڵە
خواردنم گژوگیاو بەروبومی
درەختە، زۆر حەزیشم
لەهەنگوینە
مەلە دەزانم و ماسی ڕاودەکەم
گەلێك جۆرم هەیە،
سپی، بۆر، ڕەش
لەکوێستانو گەرمیان دەژیم

# باڵندەی بیتوهۆی



ئەم باڵندەیە تەپلە لەسەریشی پێدەڵێن، لە بەرزاییو جەنگڵستانەکانی گینیای تازە )ئەو دورگەیەی بە زەریای هێمنەوەیەو دەکەوێتە باکووری ئوستورالیا( دەژی.

پێش دۆزینەوەی ئەم باڵندەیە زاناکان لەو بروایەدا نەبوون کە باڵندەی ژەهراویو ژەهر ڕێژ هەبێت. بەڵام بۆیان دەرکەوت کە گۆشتی هەندێك جۆری باڵندەی بیتوهۆیو پێستەکەیانو پەرەکانیان ژەهریکی بەهێزی تیدایە، کە بەو ژەهرە دەتوانێت بۆقێك یان مشکێك بکوژێت.

ئەم ژەهرە ئەگەر بەر مرۆڤ بکەوێت دەبێتە هۆی سور هەڵگەڕانی پێست، باڵندەی بیتوهۆی بۆ بەرگری کردن لەخۆی ئەو ژەهرە بەکاردێنێت، زۆربەی جار بۆ دەرکردنی ئەو ئەسپیانەیە کە دەیدەنە ناو پەرو باڵی، دەبێتە هۆی ئاڵۆشو بێزار کردنی، هەروەها لەکاتێکیشدا بەکاری دینێت کە خشۆکە پەلاماردەرەکان بیانەوێت بەچکەکانی بخۆن.




# تەمەنی دار

ئەگەر لە باخچەکەی ماڵەوەدا دارێکت ناشت، ئەوا خۆت بەئاسانی دەزانیت تەمەنی ئەو دارە چەندە؟ دەتوانیت لەگەڵ تەمەنی دارەکانی تری ناوباخچەکە بەراوردیان بکەیت. بەڵام بەشێوەیەکی زانستی هەرەك زانراوە تەمەنی دار بە گوێرەی ئەو ئەڵقانەی تیایدا دەردەکەوێت دیاری دەکرێت، زاناکان ڕێگایەکی زۆر وردبینانەیان بۆ ناسینەوەی تەمەنی دار بەکار هێناوە ، کە لە هەموو جیهاندا پەیرەو دەکرێت ، ئاشکرایە دار لە هەرشوێنێك بێت.لە زستانی ساردا گەشە ناکەن، بەڵکو لە هاویندا گەشە بە ئەڵقەکانیان دەدەن لە ڕێگای ڕەگەکانیانەوە. بۆیە دەبینی کە دارێکی ئەستوور بە تەمەنترە وەك لە دارێکی باریك، ، زاناکان بۆزانینی تەمەنی دار هەر ئەو ڕێگایە بەکار دێنن کە پێش هەزاران ساڵ بەکار هێنراوە ئەویش لە ڕێگای ئەلقەکانی دارەوە.

ئەمە تابلۆیەکی ئیسپانیە لەچەرخەکانی ناوەندە دەگەڕێتەوە بۆ قەشە چورچو ئەژدیها. لەتەختە دروستکراوە، بۆنی تەختەکە یاریدەدەرە بۆ دۆزینەوەی تەمەنی تابلۆکە.



ئەمە وێنەی دارسنەوبەرێکە کە پێی دەڵێن (بریستلیکۆن) کە کۆنترین داری سەر زەویە.
لە ئیرلەنداش داربەڕوویەك هەیە تەمەنی حەوت هەزار ساڵی تێپەڕاندووە.



# لەقوڕی دەستکرد دروستیان دەکەین













## بـــاوان

چاوان عەلی



باوان لە قوتابخانە
ژیرو خاوێن و جوانە
هەموو ڕۆژێك نیوەڕان
ناچێتە دەر بۆ کۆڵان
هەتا پێی نەڵێن تەمەڵ
پیس و پۆخل و چەپەڵ
ئێوەش هەروەکو باوان
کۆشش بکەن هاوڕێیان
چونکە بە کۆشش کردن
ئەنجامی باش وەردەگرن

## کوردستان

نارا. تەها-پۆلی سێیەم

کوردستان وڵاتمە
نیشتمانی جوانمە
کوردستان جێی باوانم
جێی هەوڵو تێکۆشانم
نیشتمانی خۆشەویستم
مایەی کۆشش و هەستم
ئەتپارێزم تا ماوم
وەی گلێنەی چاوم



# ئەزانیت چییە؟

وەرگێڕانی/ میران ئاوات

ناوەکەی واتای زۆری هەیە

لەئاسن و پلاستیك و شتی تر دروست دەکرێت

لەئاوێنەیەك پتری پێوەیە

بەسودە بۆ گەورەو بچوك

بۆ بەکارهێنانی دەبێت خۆتی بۆ رابهێنیت

نابێتە هۆی پیسبوونی ژینگە

ئەگەر بەهەڵە بەکارت هێنا مەترسیدارە

لە وەرزشە جیهانیەکاندا بەکاردێت

بەشێوەی هێواش و بەشێوەی خێراش دەجولێتەوە

هەندێکیان ماتۆری دەخرێتە سەر

لەکار کردنیدا وزەی سروشتی بەکاردێت

دەتبات و دەتهێنێت

زانیت چیە؟ پاسکیلە

ئەگەر بردتە ماڵەوە، دایکت زۆر پێی خۆش نابێت

(هەوا)ی تیا بەکاردەهێنرێت

دوو شتی هەیە دەخولێتەوە

# دەست و پەنجەو چاوتان خۆش..


میوان هیوا


شڤان کاوە


ژیا ئازاد کوردی


هاوکار محەمەد


بەڕێز فەرەیدون


یاد سەروەت ئاغا



# پەپولەکانی باخچەی کەناری



ئاسیا



هەندرێن حکمت



هەڤاڵ عمر



زریان عەتا



کاوان حمە جزا



کاروان نامیق



عبدالله محمد صالح



دیار خلیل



مەستی مسعود



بروسك یادگار



هیڤان غفور



ئاڤێستا مەجید

# جیاوازی

دەتوانیت لەماوەیەکی کەمدا جیاوازیەکانی ئەم دوو وێنەیە دیاری بکەیت..؟






# پەندێك لە پیتەکاندا

پەندێکی کوردی تێکەڵاوی ئەم وشانە بوە ،بەهۆی هێمای سەرەتاوە بگەڕێ بەدوایدا تا کۆتایی پەندەکە دەدۆزیتەوە




پەندەکە : ( مالی سپی بۆ رۆژی رەش )

# فەرهەنگی کەناری

بسکویت:
biscuit

مۆز:
banana

هەرمێ:
pear

پرتەقاڵ:
orange

سێو:
apple

هێلکە:
egg

گۆرەوی:
sock

کراس:
shirt

شیرینی:
sweets

پێڵاو:
shoes

دەرزی:
pins

شقارتە:
matche

قۆپچە:
button

# ئەم شتانەی خوارەوە دەناسمەوە



# سەرکێشی ماسیە بچکۆلەکە

وەرگێرانی: هاژە ئازاد





رۆژێك دایکی ماسیە بچکۆلانەکە، بەماسیە زەردەی ووت کە لە دوێنیەوە ماسیە بچکۆلانە نەگەراوەتەوە ماڵ. داوایلێکرد بەڵکو بچێت بەدوایدا بگەرێت و بیدۆزێتەوە.



ماسیە زەردەش ووتی زۆرباشە دەچم بەدوایدا دەگەرێم، بەڵکو بەخێرایی بیدۆزمەوە، نەبێتە خۆراکی ماسیە درندەکان.



لەو شوێنەدا کە ئەمان گفتوگۆیان لێدەکرد، دوو ماسی قرش گوێیان لەقسەکانیان بوو، بۆیە بریاریاندا پێشتر بگەرێن و بیدۆزنەوەو بیخۆن.



ماسیەزەردە رێگەی گرتەبەر بەرەوقوڵایی دەریا.



لە رێگا کیسەڵێکی بینی لێپرسی ! ئەرێ ماسێکی بچکۆلانەت نەدیوە ؟ ئەویش ووتی بەڵێ بینیومە رووەو رۆژئاوا رۆیشت.



ماسیە زەردە بەرەو رۆژئاوا کەوتە رێ، قرژاڵێکی سوری بینی، هەواڵی ماسیە بچکۆلانەی لێپرسی ئەویش ووتی بینیم بەرەو گیازەبەن و لیکنالاوەکان رۆیی.



ماسیە زەردە خێراتر رۆیشت تا گەیشتە قوڵایی گیا زەبنگەکان، بینی ماسیە بچکۆلانە کەوتۆتە ناو گیاکانەوە جوڵەی لێبراوە.



ماسیە زەردە تواناو زیرەکی خۆی بەکارهێنا تا رزگاریکرد، پێکەوەگەرانەوە بۆ ماڵ. ماسیە بچکۆلە بەڵێنیدا کەجارێکی تر بەتەنها دورنەکەوێتەوە.




CULTURAL & PUBLIC
CHILD MAGAZINE
ISSUED BY (KENARI)
EDITING BOARD

گۆڤارێکی رۆشنبیریی
گشتیی ئەهلییە بۆ منداڵان
مانگی جارێك دەزگای
( کەناری ) دەریدەکات

خاوەنی ئیمتیاز : ئازاد مەحمود
سەرنووسەر : رۆزا حەمە ساڵح

هاوکاران :
ئاوات مەحمود
جەلیل حسێن
هاژە ئازاد مەحمود
کاوان ئەبوبەکر
شیلان حەمە صالح

ژمارە ( ١٦ )
نیسانی ٢٠٠٤
No.: (16) 2004
گوڵان ٢٧٠٤ی کوردی

چاپخانەی دیلان
تیراژ : ( ٢٠٠٠ ) دانە
نرخ ( ٥٠٠ ) دینار

ناونیشان :
سلێمانی - شەقامی سالم
بازاڕی ئالان - بەرامبەر مۆزەخانە
سندوقی پۆستە : ( ١٤٠ )

# شاخی رەنگاو رەنگی گوێزە

بێکەس

شاخی رەنگاو رەنگی گوێزە باعیسی کەیفو سروور
هەردەمە بەرگێ ئەپۆشێ گاە سپی . گاە سەوزو سوور
وەسفی قەومی کورد ئەکەی تۆ بەم هەموو رەنگانەوە
رەنگی سوورت شاهیدە بۆ کورد کە قەومێکە جەسوور
بەرگی بێ گەردو سپیشت ظاهرە هاوار ئەکا:
قەومی کورد دڵ سافو پاکن میللەتێکن بێ قسور
بەرگی سەوزیشت ئەڵێ : ئەم خاکە هەر شینایيە
پڕ لە دەغڵو دانو کانی سەر بەرزقو پڕ لەنوور
ئەی وەتەن شایانی فەخری واجبە مەدحت بکەم
دارو بەردت چەشنی گەوهەر خاکو خۆڵت وەك بلوور

